# دیـــــــاردە زانـــســـتـــیـــەکـــان



ئامادەکردن : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد

بەڕێوبەری ئەکادیمیای زانستی کوردی

**ناوی کتێب : دیاردە زانستیەکان**

**ئامادەکردن : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد**

**ناوەند : ئەکادیمیای زانستی کوردی**

**ساڵی بڵاوکردنەوە : ٢٠٢٥**



# پێشەکی

**ئەم بەرهەمە تایبەتە بە هەندێک لەو دیاردانەی کە مرۆڤ کاتێک دێتە ژیانەوە پرسیاری بۆ دروست دەبێت دەربارەیان ، بەڵام زۆرجار یان هەر وەڵامەکە نادۆزێتەوە یاخود وەڵامە ڕاستەکەی دەست ناکەوێت ، پرسینی ئەم پرسیارانە لە خۆمان زۆر گرنگ و پێویستە تاکو ئاشنا ببین بە دەوروبەر و زیاتر لە جیهانەکەمان تێبگەین ، تێگەیشتن لە پرسیار نیوەی وەڵامە چونکە لەناو هەزاران پرسیاردا کە پرسیارێکی دیاریکراو هەڵدەبژێرین ئەوە واتا دیاریمان کردووە کە لە کوێوە بەدوای وەڵام بگەڕێین و بەمەش سنوری وەڵامەکە بەهۆی پرسیارەکەوە سنوردار کراوەتەوە ، بەڵام ئەم سنورداریە واناکات کە پرسیاری زانستی تەنها یەک وەڵامی هەبێت ، دەکرێت وەڵامی تریشی هەبێت ، هەر بۆیە سنووری وەڵام بۆ پرسیارێکی سنووردار بێ سنووره ، هیوادارم سود لەم بەرهەمە ببینن کە خۆی دەبینێتەوە لە وەڵامدانەوەی (٣٢) پرسیار**

**هەژیر**

**پرسیار : بۆچی ئاسمان شینه ؟**

**ڕووناکی خۆر که ڕەنگی سپییە پێکهاتووە لە ڕەنگەکانی پەلکە زێڕینە کە ئەوانیش بریتین لە :**



- **سور (درێژترین شەپۆل)**
- **پرتەقاڵی**
- **زەرد**
- **سەوز**
- **شین**
- **شینی تۆخ**
- **مۆر یان وەنەوشەیی (کورتترین شەپۆل)**

**کاتێک ڕووناکی خۆر تێدەپەڕێت بەناو بەرگە هەوای زەویدا ، بەرکەوتنی دەبێت لەگەڵ هەموو گەرد و تەنۆلکە بچوکەکانی بەرگە هەوا ، بەمەش بەش بەش دەبێت بە هەموو لایەدا ، ڕەنگی شین درێژە شەپۆلیەکەی کەمتر و کورتترە ، بەمەش لەچاو ڕەنگەکانی سەوز و زەرد و پرتەقاڵی و سور زیاتر پەرش و بڵاو دەبێتەوە لە بەرگە هەوادا ، ئەگەرچی ڕەنگی وەنەوشەییش پەرش و بڵاو دەبێتەوە ، بەڵام چاوی ئێمە بەشێوەیەک هەستیارە کە شینە بە زاڵتر دەبینێت ، ئاسمان شینتر دیارە کاتێک خۆر لە گۆشەیەکی**

**بەرزترەوە لە زەوی بدات چونکە درێژە شەپۆلە کورتەکان پەرش و بڵاو دەبنەوە ، بەڵام لە حاڵەتی خۆر ئاوابوون یان خۆر هەڵاتن ئاسمان بە ڕەنگی سور یان پرتەقاڵی یان زەرد دەردەکەوێت چونکە تێپەڕبوونی ڕووناکی خۆر لەلاکانەوە درێژی شەپۆلی زیاتری پێویستە ، هەبوونی خۆڵ یاخود پیسبوونی هەوایی کاریگەری هەیە لەسەر پرۆسەی پەرتبوون و پەرشبوونی ڕەنگەکان ، بەمەش لەو حاڵەتانەدا ئاسمان دەکرێت ڕەنگی شینێکی کاڵی هەبێت یاخود نزیک لە سپییەوە ، بەرگە هەوای هەسارەکان کاریگەری هەیە لەسەر ڕەنگی ئاسمانی هەسارەکە ، بۆنمونە مەریخ بەرگە هەوایەکی تەنکتری هەیە لەگەڵ ژینگەیەکی خۆڵاوی ، بەمەش وادەکات ئاسمانەکەی سوور دەرکەوێت**



## پرسیار : بۆچی لە هاوین باران نابارێت ؟

**ئەم پرسیارە لەوەوەدێت کە لە هاویندا دونیا گەرمە و بەهۆی ئەم گەرمیەشەوە کە ئاوەکان دەبن بە هەڵم ببێتە هۆی هەور و باران ، بەڵام لەڕاستیدا بەم شێوەیە نییە ، بەڵکو لە هاویند بەرگەهەوا پەستان تێیدا بەرزە بەمەش بەرگەهەوا لە دۆخێکی جێگیردا دەبێت کە ڕێگری دەکات لەوەی هەور و پاشان باران دروست بکات ، هەروەها ئەگەرچی لە هاویندا هەڵم زیاتر دروست دەبێت بەڵام گەرمی هەوا یارمەتیدەر دەبێت بۆ لەخۆگرتنی شێیەکی زۆر بەبێ ئەوەی چڕی بکاتەوە بۆ هەور ، کەواتە مەرج نییە کە هەڵمی ئاو هەبوو ببێت بە هەور و باران ، دەکرێت هەڵمەکە لەڕێگەی با و هەواوە بگوازرێتەوە بۆ ناوچەیەکی تر ، هەندێک لە خاک و ڕووەکەکان هەڵدەستن بە هەڵمژینی بەشیک لەم هەڵمە ، هەربۆیە ئەمانە وادەکەن کە لە هاوین باران نەبارێت و لە زستان هەڵمەکە بگۆڕدرێت بەهۆی ساردی بەرگە هەوا و هاندانی بۆ چربوونەوەی هەڵمەکە لەسەر شێوەی هەورە**



## پرسیار : بۆچی ئاو بێڕەنگە ؟

**ئاو بە بێڕەنگی بۆ چاوی مرۆڤ دەردەکەوێت چونکە زۆر بە لاوازی دەتوانێت ڕووناکی هەڵبمژێت و ڕەنگێکی بینراو نیشان بدات ، بەڵام ئاوێکی زۆر خاوێن بڕێکی کەم لە ڕەنگی شینی هەیە ، کە لە قەبارەی گەورەی وەک دەریا و زەریاکان زیاتر دەردەکەوێت بە ڕەنگی شین ، ڕووناکی کە لە حەوت ڕەنگەکەی شەبەنگ پێکهاتووە کاتێک تێدەپەڕێت بەناو ئاودا ، ئەوا ڕەنگی سوور هەڵدەمژێت و ڕەنگی شین بە شێوەیەکی لاواز پەرتەوازە دەکات ، هەر بۆیە دەریا و زەریاکان بە ڕەنگی شین دەردەکەون ، چونکە ڕەنگی سور هەڵدەمژرێت و ئەوەی کە وێنە ئەداتەوە لە چاوی ئێمەدا ڕەنگە شینەکەیە کە هەڵنامژرێت و پەرتەوازە دەبێت**



## پرسیار : زەوی چەنێک قورسە ؟

بارستەی زەوی دەکاتە (5,972,200,000,000,000,000,000,000) بۆ تێگەیشتن لەم ژمارەیە بەم شێوەیە ڕوونی دەکەینەوە :

یەک فیلی ئەفریقی نێر بارستەکەی 5896 کیلۆگرامە ، 100 فیل بارستاییەکەیان 589670 کیلۆگرامە ، یەک ملیار فیل بارستاییەکەیان (5,896,700,000,000,000) کیلۆگرامە ، سەرەڕای ئەوەی هێشتا ئەم بارستەیە ناگاتە بەشێکی کەمی زەوی بەڵام بۆ ڕوونکردنەوە و تێگەیشتن بەم شێوەیە ڕوونمان کردەوە تا بزانرێت بارستەی زەوی چەند زۆر و گەورەیە ، ئەی فێرخواز بزانە کەوا بە چەند هەنگاوێک دەتوانرێت بارستەی زەوی بدۆزرێتەوە :

1. جێگیری هێزی ڕاکێشان (gravitational constant) کە لە ڕێگای یاسای نیوتن بۆ هێزی ڕاکێشانی گەردوون دەدرۆزێتەوە کە ئەم یاسایەیە :

$$F = G\frac{m_1 m_2}{r^2}$$

تێیدا (F) بریتیە لە هێزی ڕاکێشانی نێوان دوو بارستە هەنێ جار بە (g) دەردەبڕدرێت

(G) بریتیە لە جێگیری هێزی ڕاکێشان کە دەکاتە:

$(6.67300 \times 10^{-11} m^3 kg^{-1} s^{-2})$

(m1m2) بریتین لە بارستەی دوو تەن

(r) بریتیە لە دووری نێوان ناوەڕاستی هەریەکێکیان لەوەی تر

ئەگەر بۆ زەوی هەژماری بکەین ئەوا g دەکاتە $9.81\frac{m}{s^2}$

نیوەتیرەی زەوی دەکاتە $(6.371 \times 10^6\ \text{m})^2$

جێگیری تاودانی زەوی دەکاتە $6.67430 \times 10^{-11}\ \text{m}^3\text{kg}^{-1}\text{s}^{-2}$

واتا هاوکێشەکە بەم شێوەیەی لێدێت :

$$M_{\text{Earth}} = \frac{9.81\ \text{m/s}^2 \cdot (6.371 \times 10^6\ \text{m})^2}{6.67430 \times 10^{-11}\ \text{m}^3\text{kg}^{-1}\text{s}^{-2}}$$

$$M_{\text{Earth}} \approx 5.97 \times 10^{24}\ \text{kg}$$

2. تـــاقیکردنەوەی پەنـــدۆڵ : لەم تـــاقیکردنەوەیە هێـــزی کێشـــکردنی زەوی (g) دەدۆزرێـــتەوە و پاشـــان یاســـاکەی ســـەرەوە بەکاردەهێنرێـــت بەم شـــێوەیە : یاســـای پەندۆڵ دەکاتە :

$$T = 2\pi\sqrt{\frac{L}{g}}$$

که (L) بریتیه له درێژی پەندۆڵ و (g) بریتیه له هێزی کێشکردن و (T) بریتیه له ئەو کاتەی پێویستە بۆ پەندۆڵێک که له خاڵێکی دیاریکراودا دەربچێت و بگەڕێتەوە هەمان خاڵ





**پرسیار : ئایا ئەگەر شەکر و خوێ تێکەڵ بوون چۆن لەیەکیان جیا بکەینەوە ؟**

**ئەگەر هەردووکی ڕەق بوون :**

**ئەوە کحولی 100٪ ی دەکەین بەسەردا بەمەش شەکرەکە دەتوێتەوە و خوێکە وەک خۆی دەمێنێتەوە پاشان قوماشێک بەسەر پەرداخێک دەهێنین و کرداری فلتەرکردن دەکەین بەمەش خوێکە لەسەر قوماشەکە دەمینیتەوە و کحول و شەکرەکە دێتە خوارەوە پاشان گیراوەی شەکر و کحولەکە لە مەنجەڵێکدا دەکوڵێنی بەمەش کحولەکە دەڕوات و نیشتوەکەی تەنها شەکرەکە دەمێنیتەوە**

**ئەگەر هەردووکی شل بوون :**

**واتا شەکر و خوێ تێکەڵ کرابن بەهۆی ئاوەوە لێرەدا کەمێک تۆڵوین زیاد دەکەین بۆ گیراوەکە پاشان ئامێری سەنتەرفیوج بەکاردەهێنین و دواتر دەبینین دوو چین دروست دەبێ چینێک لە گیراوەی شەکر و تۆڵوینەکەیە و چینەکەی خوارەوەشی گیراوەی خوێ و ئاوەکەیە بەمەش بە ئاسانی جیادەکرێنەوە و هەر یەکێکیان بە ڕێگەی کوڵاندن شلەکەی دەڕوات و نیشتوە وشکەکەی دەمێنیتەوە کە خوێ و شەکرەکەیە**

## پرسیار : ئایا خۆر ڕەنگی سپیە یاخود زەردە ؟

خـۆر لە ڕاسـتیدا ڕەنگـی سـپیە چـونکە هەمـوو ڕەنگەکـانی ڕووناکی دەردەدات ، کە ئەم ڕەنگـانە یەک دەگرن و ڕووناکی سپی دروست دەکەن ، هۆکـاری دەرکەوتنیشی بە ڕەنگی زەرد بەهۆی پەرشبوونی ڕووناکیەکەیە لە بەرگەهەوادا ، کاتێک ڕووناکی خۆر تێدەپەڕێت بەنـاو بەرگەهەوای زەویـدا ، ئەو ڕەنگـانەی درێژەشـەپۆلیان کـورتە وەک (ڕەنگی شین و مۆر) بە ئاڕاستەی جیاوازدا پەرت و بڵاو دەبـنەوە بەهـۆی ئـاوێتە و تەنـۆلکە بچوکەکـانی نـاو هەوا ، ئەم پەرت بـوونە بـڕی ڕوونـاکی شـین کەم دەکـاتەوە کە بگـات بە چـاو ڕاستەوخۆ لە خۆرەوە ، بەمەش وادەکات کە خۆر ڕەنگەکەی زەرد بۆ پرتەقاڵی دەربکەوێت ، بەتـایبەتیش کاتی خۆرهەڵهاتن و خۆرئاوابوون ، بەڵام لە نیوەڕواندا ڕەنگەکەی نزیکە لە سپیەوە چونکە ڕووناکیەکی کەمتر پەرت دەبێت لەناو بەرگەهەوادا



**پرسیار : مرۆڤ چۆن دەتوانێت ڕەنگە جیاوازەکان ببینێت و جیایان بکاتەوە لەیەکتر ؟**

**چاوی مرۆڤ ئەندامێکی تایبەتی تێدایە بۆ ناسینەوە و دیاریکردنی سنورێکی زۆر فراوان لە ڕەنگە جیاوازەکان ، بەم شێوەیە کاردەکات:**

**وێنەوەرگرەکان دوو جۆرن:**

**ڕۆد : (rod) – ئەمانە بەرپرسیارن لە بینینی ڕووناکی نزم ، ڕەنگ دیاری ناکەن ، لە چاوی مرۆڤدا لە ناوچەی ڕیتێنا (retina) – نزیکەی ١٢٠ ملیۆن ڕۆد هەیە**

**کۆن : (cone) – ئەمانە بەرپرسیارن لە بینینی ڕەنگەکان و باشترین ڕۆڵیان هەیە لە ڕووناکی بەتیندا ، چاوی مرۆڤ نزیکەی ٦ ملیۆن کۆنی تێدایە ، کە دابەشکراون بۆ سێ جۆر بەپێی هەستیاریان بۆ درێژە شەپۆلە جیاوازەکانی ڕوناکی ، بەم شێوەیە:**

**س-کۆن : (s-cone) هەستیارە بە کورتە شەپۆلەکانی وەک ڕووناکی شین**

**م-کۆن : (m-cone) هەستیارە بە ناوەندە شەپۆلەکانی وەک ڕووناکی سەوز**

**ل- کۆن : (l-cone) هەستیارە بە درێژە شەپۆلەکانی وەک ڕەنگی سور**

**کاتێک دوو شەپۆلی جیاواز تێکەڵ ببن ، مێشک هەوڵدەدات هەردوو زانیاریەکەی بۆی هاتووە لە دوو شەپۆلەکە بیکات بە یەکێک ، بۆنمونە : ئەگەر هاتوو م-کۆن و ل-کۆن هەردووکی بەڕێژەیەکی زۆر و بەرز دەرکەوتن ، ئەوا مێشک بە ڕەنگی زەرد لێکی دەداتەوە**

**پرسیار : مرۆڤ چۆن دەتوانێت بۆنە جیاوازەکان بناسێتەوە و لەیەکتریان جیا بکاتەوە ؟**

**مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی سیستەمی ئاڵۆز و هەستیاری (ئۆلفاکتۆری - olfactory) بۆنەکان لەیەکتر جیا بکاتەوە و بیانناسێتەوە ، بەم شێوەیە کاردەکات :**

**١ ) چونە ناوەوەی ئاوێتەکانی بۆن بۆ ناو لووت : کاتێک لە ڕێگای هەناسەوە بۆنەکان لە ژینگەیەکی دیاریکراوەوە دێنە ناو لووت و دەتوێنەوە لەناوچەی (میۆکۆس ئۆلفاکتۆری - mucus olfactory) ، کە دەکەوێتە بەشی پشتەوەی بۆشایی لوت**

**٢) هەستکردن بە بۆنەکە لە ڕێگەی هەستەوەرەکانی ئۆلفاکتۆری : لە ناو لوتدا بە ملیۆنان هەستەوەری دەماریی تێدایە کە هەریەکەیان و جۆرە پرۆتینێکی تێدایە کە دەتوانێت یەکبگرێت لەگەڵ ئاوێتەی جۆرە بۆنێکی دیاریکراو ، مرۆڤ نزیکەی ٤٠٠ جۆری جیاواز لە هەستەوەری ئەلفاکتۆری تێدایە**

**٣) گواستنەوەی ئاماژەکە : کاتێک ئاوێتەی بۆنێک یەکدەگرێت لەگەڵ هەستەوەرەکان ، دەیگۆڕێک بۆ نیشانە و ئاماژەیەک کە لە ڕێگەی دەمارە هەستەوەرەکانی بۆنکردنەوە بگوازرێتەوە بۆ مێشک**

**٤) لێکدانەوەی بۆنکردن : کە بۆنەکە دەگات و دەناسرێتەوە ، لێرەوە ئاماژەکان بۆ بەشە جیاوازەکانی مێشک دەنێدرێن لەڕێگەی ناوچەیەکەوە پێی دەوترێت (ئۆلفاکتۆری بەڵب -**

olfactory bulb) ، لەو بەشە جیاوازانەشی کە بۆی دەڕوات بۆنمونە (ئۆلفاکتۆری کۆرتێکس - olfactory cortex) و (لیمبیک سیستەم - limbic system)

٥) وەرگرتن و ناسینەوە : ئۆلفاکتۆری کۆرتێکس سیگناڵەکان وەردەگرێت و دەیبەستێتەوە بە لیمبیک سیستەم کە تێیدا هەست و یادگاریەکان دەمێننەوە ، یارمەتیدەر دەبێت بۆ ناسینەوە و لێکدانەوەی مانای بۆنەکان ، هەربۆیە هەندێک بۆنی دیاریکراو یادگاری وهەستی زۆر بەهێز دەهێننەوە یادی مرۆڤ

٦) ڕۆڵی مێشک : مێشک ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە جیاکردنەوە و ناسینەوەی بۆنەکات ، دەتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان هەزاران بۆنی جیاواز بەپێی ئەو جۆرە وەرگرەی کە لەناو لوتدا چالاک دەبێت بەهۆی بۆنەکانەوە

هەموو مرۆڤێک هەمان هەستەوەری و هەستیاری نییە بۆ بۆنەکان ، بەپێی جیاوازی بۆماوەیی و تەمەن و دۆخی تەندروستی ، بۆنمونە ئەو کەسانەی ئاستی بۆنکردنیان زۆر بەهێزە پێیان دەوترێت (هیپەرۆسمیا - hyperosmia) و ئەو کەسانەی کە ئاستی بۆنکردنیان زۆر لاوازە پێیان دەوترێت (هیپۆسمیا - hyposmia) ، ئەوانەشی بەتەواوەتی هەستی بۆنکردنیان لەدەست داوە پێیان دەوترێت (ئەنۆسمیا - anosmia)

## پرسیار : چۆن هەورە قورسەکان دەتوانن لە ئاسماندا بمێننەوە لەکاتێکدا پڕ ببن لە ئاوی باران ؟

لەوانەیە هەورەکان قورس دەربکەون کە دڵۆپە ئاویان تێدا هەبێت ، بەڵام ئەمە واناکات کە نەتوانن لە ئاسماندا بمێننەوە ، هۆکاری پشت ئەمەش ڕوونکردنەوەیەکی فیزیاییە بەم شێوەیە:

هەورەکان پێکهاتوون لە دڵۆپە ئاو یاخود کریستاڵی بەفر کە زۆر بچوکن و کێشیان زۆر کەمە ، کاتێک بەهۆی هەوای گەرمەوە ڕووی زەوی گەرم دەبێت ، دەبێتە هۆی ئەوەی ئاوەکان بە هەڵم ببن و لەڕێگای هەواوە بەرز ببنەوە بۆ ئاسمان و لەوێدا سارد ببنەوە ، بەمەش ئاوەکان لە ئاسماندا دەگۆڕێن بۆ هەور ، ڕونکردنەوەی ئەم دیاردەیەش پەیوەندی بە چڕیەوە هەیە ، هەوا لەناو هەورەکەدا چڕیەکەی کەمترە لەچاو هەوای دەوروبەری ، بەمەش وادەکات لە ئاسماندا بمێنێتەوە ، کاتێک بڕێکی زۆر ئاو لەناو ئەم هەورانە کۆدەبێتەوە ، بەشی ئەوە قورس دەبن کە بگۆڕێن بۆ باران و داببارێن

**پرسیار : بۆچی ئەستێرەکان لە شەواندا لە ئاسمان دەگەشێنەوە (دەبریقێنەوە) ؟**

**دیاردەی گەشانەوەی ئەستێرەکان پێی دەوترێت (stellar scintillation) ، هۆکاری ئەم گەشانەوەیە جوڵە و ناجێگیری بەرگەهەوایە ، کاتێک ڕووناکی ئەستێرەیەک لە گەردوونەوە دێت و دەگاتە زەوی ، پێویستە بەناو چەند چینێک لە هەوادا تیپەڕ ببێت کە چڕی و پلەی گەرمی جیاوازیان هەیە ، ئەم چینانە دەبنە هۆی شکانەوەی ڕووناکی بە ئاڕاستەی جیاواز ، بەرگەهەوا کاریگەرە بە سێ شت (شەپۆلی هەوا ، گۆڕانی گەرمی ، با) بەمەش شکانەوەی ڕووناکیەکە دەگۆڕێت بەهەمان شێوە ، ئەمە وادەکات ئەستێرەکە گەشاوە دەربکەوێت و گەشانەوەکەی کەم و زیاد بکات ، ئەستێرەکان ناگەشێنەوە کاتێک لە گەردوونەوە لێیان بڕوانیت ، بەڵام ئەم دیاردە تایبەت و جوانەیان بۆ دروست بووە کاتێک لە زەویەوە لێیان بڕوانیت**

## پرسیار : بۆچی گەڵای درەختەکان لە بەهاردا سەوز دەبن و لە پایزدا هەڵدەوەرن ؟

**گەڵاکان لە بەهاردا ڕەنگیان دەبێت بە سەوز بەهۆی بەرهەمهێنانی (کلۆرۆفیل) کە ئەم ڕەنگە ڕۆڵی دەبێت لە دیاردەی ڕۆشنەپێکهاتن ، بەم شێوەیە :**

**لە ماوەی بەهاردا ، بەرکەوتن بە ڕووناکی خۆر زیاد دەکات و پلەی گەرما بەرز دەبێتەوە کە ئاماژە دەبێت بۆ درەختەکان کە بە هۆش بێنەوە لەو سوڕە زستانیەی تێیدا بوون ، دەست دەکەن بە بەرهەمهێنانی (کلۆرۆفیل) لەناو گەڵاکانیاندا کە ڕووناکی خۆر هەڵدەمژێت و دەیگۆڕێت بۆ وزە لە ڕێگەی پرۆسەی (ڕۆشنەپێکهاتن - photosynthesis) ، کلۆرۆفیل ڕەنگی سەوز دەبەخشێت بە گەڵاکان و مادەیەکی گرنگ و پێویستە بۆ یارمەتی گەشە و ژیانەوەی درەختەکە ، بەڵام لە پایزدا کە ڕۆژ کورتترە ، پلەی گەرما دادەبەزێت و تینی ڕووناکی خۆر کەمترە ، ئەمەش نیشانەیە بۆ درەختەکان کە بەرهەمهێنانی (کلۆرۆفیل) هێواش و خاو بکەنەوە ، کە بەرهەمهێنانی کلۆرۆفیل کەمبووەوە ، هەندێ ڕەنگی تر لەسەر گەڵاکە دەردەکەون وەک (کارۆتینۆید) کە ڕەنگی زەرد و پرتەقاڵی بە گەڵاکان دەبەخشێت ، هەروەها (ئەنثۆسیانین) کە ڕەنگی سورد و مۆریان پێ دەبەخشێت ، ئەم ڕەنگانە لە نەبونی کلۆرۆفیلدا دەبنە ڕەنگێکی بینراو و بەدیکراو و زاڵدەبن بەسەر گەڵاکەدا ، هەربۆیە لە پایزدا کە درەختەکە پشت بەخۆی**

**دەبەستێت و ئەو وزەیەی هەڵیگرتووە بەکاریدەهێنێت بۆ مانەوە ، لەبەرامبەردا گەڵاکانی زەرد هەڵدەگەڕێن و دەوەرێن**



## پرسیار : بۆچی بیلبیلەی چاو لە تاریکیدا فراوان و گەورە دەبێتەوە ؟

**بیلبیلەی چاوی ئێمە کاتێک لە شوێنێکدا بێت کە ڕووناکی تێیدا کەمە ئەوا بیلبیلەکە فراوان دەبێت تاکو زۆرترین ڕووناکی وەربگرێت ، بەمەش یارمەتیمان دەدات لە تاریکیدا بە باشترین شێوەی لە توانادایە ببینین ، ئەم پرۆسەیە بە ماسولکەیەک کۆنترۆڵ کراوە کە پێی دەوترێت (ئیریس) کە بەشە ڕەنگدارەکەی چاوە ، کاتێک شوێنێک تاریک دەبێت ، ماسولکەی ئیریس دەکشێت و دەبێتە هۆی فراوانبوونی بیلبیلەی چاو ، کە فراوانبوو ڕووناکیەکەی زیاتری پێدا تێپەڕ دەبێت ، کە ئەمەش یارمەتیدەر دەبێت بۆ بینینێکی باشتر لە تاریکیدا ، بە پێچەوانەشەوە لە ڕۆژی ڕووناک یاخود هەبوونی ڕووناکی بەهێزدا ، ماسولکەی ئیریس دەچێتەوە یەک و بیلبیلەی چاو بچوک دەبێتەوە تاکو کەمترین ڕووناکی پێویست بۆ بینین وەربگرێت**



## پرسیار : بۆچی ئاسن کاتێک لە پلەی گەرمی ئاساییدا دەستی لێ بدرێت ساردترە لەچاو تەختەیەک ؟

**ئاسنەکان ساردترن لە چاو تەختە لە پلەی گەرمی ئاساییدا چونکە توانای گەیاندنی گەرمیان بەرزترە ، ئاسن گەیەنەرێکی زۆر باشە بۆ گەرمی ، واتا دەتوانن گەرمی و ساردیەکان زۆر خێراترن بگوازنەوە کاتێک بەرکەوتەمان لەگەڵیاندا هەبێت لە چاو ئەوەی تەختە دەیتوانێت ، کە دەست دەدەین لە ڕووکەشی ئاسنێک (کانزایەک) ، گەرمی دەست بەخێرایی دەگات بە ئاسنەکە ، بەمەش وادەکات پێست پلەی گەرمی بەخێرایی لەدەست بدات و هەست بەو ساردیە بکات ، بەڵام تەختە گەیەنەرێکی لاوازی گەرمیە ، بۆیە بەخێرایی ناگوازرێتەوە گەرمی و ساردیەکەی بۆ پێستی ئەو کەسەی دەستی لێدەدات ، گەرمتر لە چاو ئاسن دەردەکەوێت تەنانەت ئەگەر هەردووکیان لەهەمان پلەی گەرمیدا ببن**



**پرسیار : بۆچی چۆكۆلات كاتێک لەناو دەست هەڵی بگرین دەتوێتەوە ؟**

لەبەر ئەوەی پلەی توانەوەی نزمە ، كە نزیكە لە پلەی گەرمی جەستەی مرۆڤەوە ، چۆكۆلات كەرەی كاكاوی تێدایە ، كە جۆرە چەوریەكە كە لە نزیكەی ٣٠ بۆ ٣٥ پلەی سەدی دەتوێتەوە ، لەبەر ئەوەشی كە جەستەی مرۆڤ پلەكەی زیاترە لەو پلە گەرمییە بۆیە وادەكات كە گەرمی لە پێستەوە بگوازرێتەوە بۆ چۆكۆلاتەكە و نەرمی بكات و پاشان بیتوێنێتەوە ، هەر ئەم تایبەتمەندیەشە وادەكات كە كاتێک چۆكۆلات دەخورێت لەدەمدا زۆر خێرا دەتوێتەوە و شل دەبێتەوە و تامەكە بەخێرایی بڵاو دەكاتەوە



## پرسیار : بۆچی بەشێوەیەکی گشتی کەسێک باوێشک دەدات کاتێک ببینێت کەسی بەرامبەر باوێشک دەدات ؟

ئەم دیاردەیە پێی دەوترێت "contagious yawning" ، کە تێیدا دوو کەس لەهەمان کاتدا باوێشک دەدەن ، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە لە دەمارەکانی مێشکی مرۆڤدا هەندێک دەمار هاوشێوەی ئاوێنە کاردەکەن ، کاتێک دەبینیت کەسێک باوێشک دەدات ، ئاماژە دەنێرن بۆ مێشک کە تۆش باوێشک بدەیت ، ئەم دەمارانە چاودێری ڕەفتار و کاردانەوەکانی بەرامبەر دەکەن ، باوێشکدان لەدوای کەسی بەرامبەر ڕێگایەکە بۆ تێگەیشتن و دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ هەستەکانیاندا ، توێژینەوەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە داوە کە ئەوکەسانەی زیاتر هاوسۆزی یەکتر زیاتر باوێشکی بەرامبەر زاڵ دەبێت بەسەریان تاکو ئەمانیش باوێشک بدەن ، بیرخستنەوەیەکی سادەیە کە ئێمەی مرۆڤ چەندە بەیەکەوە بەستراوین تەنانەت لە باوێشکێکیشدا



**پرسیار : چ شتێک وادەکات لێدانی دڵ خێراتر ببێت لەکاتی ڕاهێنانە وەرزشیەکاندا ؟**

**لێدانی دڵ خێرا دەبێت لەبەر ئەم هۆکارانە :**

**١) زیادبوونی چالاکی ماسولکە : لەکاتی ڕاهێناندا ماسولکەکان زیاتر ماندوو دەبن بەمەش ئۆکسجین و گلوکۆزێکی زۆرتر بەکاردەهێنن ، ئەمەش وادەکات کە بەخێرا لە سیستەمی سوڕی خوێنەوە کە لە دڵەوە دێت ئۆکسجین و گلوکۆزی زۆرتر بێت و وەک گەنجینە یاخود سوتەمەنیەک کاربکات بۆ پەکنەکەوتنی ئەو پێداویستیانە**

**٢) سیستەمی دەماری هاوسۆزی : وادەکات کە لەبەر بەهێز مانەوەی کەسەکە ئاماژە بنێرێت بۆ دڵ کە ئۆکسجین و وزەی زۆرتر بنێرێت بۆ ماسولکەکان**

**٣)هۆرمۆنەکان : هۆرمۆنی وەک ئەدرینالین (ئیپینیفرین) دەرژێندرێت ، کە وادەکەن لێدانی دڵ خێراتر بێت و دەبنە هاندەر بۆ خێرا ڕۆیشتنی خوێن بە جەستەدا**

**٤)لابردنی دوانە ئۆکسیدی کاربۆن : کە ماسولکە وزەی زۆرتری بەرهەم هێنا ، دوانە ئۆکسیدی کاربۆن وەک پاشەڕۆ بەرهەم دەهێنێت ، خێرایی سوڕی خوێن یارمەتیدەر دەبێت کە ئۆکسجینی نوێ بێنە ناو ماسولکەکان و خێراتر دوانە ئۆکسیدی کاربۆنەکان لابدرێن**



**پرسیار : بۆچی لەکاتی بڕینی پیازدا فرمێسک بە چاوەکاندا دێت ؟**

**پیاز چەندین جۆر لە ئاوێتەی گۆگرد (سەڵفەر** sulfur) **تێدایە کە زیانبەخش نیین لەکاتی بەرکەوتن لەگەڵیاندا ، بەڵام لە حاڵەتی بڕینی پیازدا چەند شتێک ڕوودەدەن کە دەبنە هۆی هاتنەخوارەوەی فرمێسک لە چاودا ، ئەوانەش بریتین لە :**

**١)دەردانی ئەنزیم : بڕینی پیاز دەبێتە هۆی دەردانی ئەنزیمێک کە پێی دەوترێت (ئەلینەیس** alliinase ) **، ئەم ئەنزیمە بەرکەوتەی دەبێت لەگەڵ ئەو ئاوێتە گۆگردیانەی لەناو پیازدا هەن**

**٢)دروستبوونی سەڵفینیک ئەسید** (Sulfenic Acid) **: ئەنزیمی ئەلینەیس ئاوێتە گۆگردیەکان دەگۆڕێت بۆ مادەی تر لەوانەش بۆنمونە ( ١-پرۆپینسەڵفینیک ئەسید** (1-propenesulfenic acid)

**٣)گۆڕان بۆ ئاوێتەیەکی کزێنەر و سوتێنەر : ١-پرۆپینسەڵفینیک ئەسید زۆر چالاکە بەمەش بەخێرایی دەگۆڕێت بۆ سین-پرۆپەینثایاڵ-س-ئۆکساید** (syn-Propanethial-S-oxide) **کە مادەیەکی زوو بەهەڵمدا چووە ، کە دەبێتە هۆی ڕشتنی فرمێسک**

**٤)بەرکەوتن لەگەڵ چاودا : کە پرۆپەینثایاڵ بەهەڵم دەچێت و بەر چاو دەکەوێت ، کارلێک لەگەڵ تەڕێتی ناو چاو دەکات بۆ بەرهەمهێنانی سەڵفەریک ئەسید (** sulfuric

**(acid که مادەیەکی سوتێنەرە و دەبێتە هۆی فرمێسک ڕشتن لە چاو و کاریگەری لەسەر لوتیش دروست دەکات**

**٥) کاردانەوە : چاو وەک کاردانەوەیەک بۆ ئەم سوتانەوەیە کە بەهەڕەشەی دەژمێرێت ، بەخێرایی لەڕێگای (lacrimal glands) فرمێسکی زۆر بەرهەم دەهێنێت بۆ پاراستنی چاو و ڕوونکردنەوەی ئەو سەڵفەریک ئەسیدەی دروستبووە**



## پرسیار : بۆچی گوڵەکان ڕەنگی جیاوازیان هەیە ؟

**جیاوازی ڕەنگ لە گوڵەکاندا بۆ چەند هۆکارێکی ژینگەیی و زیندەیی دەگەڕێتەوە ، بۆنمونە :**

**١) گوازەرەوەکان : بەشێک لەو شتانەی دەبنە هۆی گواستنەوەی بەشە نێرینەکەی گوڵ (ستامین) بۆ بەشە مێینەکانی گوڵ (ستیگما) لەو شتانەشی کە هۆکاری گواستنەوەن بۆنمونە (هەنگ ، پەپولە ، چۆلەکە ، شەمشەمەکوێرە) ، هەر هۆکارێکی گوێزەرەوەیان ڕەنگێکی جیاوازی گوڵ هەڵدەبژێرێت بۆ بەرکەوتن لەگەڵیدا ( هەنگەکان زیاتر لەگەڵ گوڵی ڕەنگ شێن و مۆر و زەرد بەرکەوتەیان دەبێت) (باڵندەکان لەوانەش باڵندەی هەمینگبێرد زیاتر لەگەڵ گوڵی سور و پرتەقاڵی بەرکەوتەیان هەیە) (شەمشەمەکوێرەکان لەگەڵ گوڵە کاڵ و سپیەکاندا بەرکەوتەیان هەیە)**

**٢) ڕەنگەکان : ڕەنگی گوڵەکان بەشێوەیەکی گشتی لە سێ جۆر ڕەنگەوە سەرچاوە دەگرن ئەوانیش : (یەکەم : ئەنثۆسیانین :کە ڕەنگی سور و مۆر و شین بەرهەم دەهێنن ، ڕەنگی گوڵەکە پشت بە ترش و تفتێکی خانەکانی ناو گوڵەکە دەبەستێت) (دووەم : کارۆتینۆید : بەرپرسن لە دروستکردنی ڕەنگی زەرد و پرتەقاڵی و سور ، ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە ڕۆشنە پێکهاتنی ڕووەکەکان ) (سێهەم : فلاڤۆنۆید(چالکۆن) : ڕۆڵیان هەیە لە دروستکردنی ڕەنگی زەردی کاڵ و سپی)**

**٣) ڕەنگی پێکهاتەیی : لە هەندێ حاڵەتدا گوڵەکە تەنها لەو ڕەنگانەوە ڕەنگی دەستناکەوێت ، هەندێک جار بەپێی پێکهاتەی وردی ڕووکەشی گوڵەکە کاتێک ڕووناکی بەردەکەوێت دەیشکێنێتەوە و دیاردەی وەک (ئیریدیسینس iridescence) دروست دەکات ، کە لە هەندێ گوڵی وەک (تیولیپس tulips) و (هایبیسکۆس hibiscus) دەردەکەوێت**

**٤) خۆپاراستن : هەندێک گوڵ بۆ خۆپاراستن لە ڕووەکخۆرەکان هەندێک ڕەنگ بەخۆیان دەبەخشن کە لەگەڵ سروشتەکە بگونجێت و نەبێتە هۆی سەرنجڕاکێشان ئەمەش وەک هەنگاوێکی خۆپارێزی**

**٥)هۆکارە هەمەجۆرەکان : هۆکاری وەک ترشی و تفتی خاک ، بەرکەوتن لەگەڵ ڕووناکی ، پلەی گەرمی ، هەبوونی مادە پەینییەکان لە خاکدا ، بۆنموونە گوڵی (هایدرانجیەس hydrangeas) لە خاکێکی ترشدا بە ڕەنگی شین دەردەکەوێت ، بەڵام لە خاکێکی تفتدا بە ڕەنگی پەمەیی دەردەکەوێت بەهۆی گۆڕان لە ڕێژەی توخمی ئەلەمنیۆم تێیدا**

**٦ ) پەرەسەندن : بە تێپەڕبوونی کات چەندین گوڵ پەرەیان سەندووە و ڕەنگی نوێ و جیاوازیان لێ بەرهەم هاتووە بەهۆی فرەچەشنی زاوزێ لەنێوان گوڵە هەمەجۆرەکاندا**



**پرسیار : بۆچی پەنگوینەکان جەستەیان بە گەرمی دەمێنێتەوە سەرەڕای ئەوەی لە بەستەڵەکەکان دەژین ؟**

**لەبەر کۆمەڵە هۆکارێک لەوانە :**

**١) پێکهاتەی جەستەیان : پێکهاتووە لە چینێکی چڕ و دژە ئاو کە دەیانپارێزێت لە ئاوی سەهۆڵاو و کەشوهەوای سارد ، لە نزیک کلکیان جۆرە ڕۆنێک بەرهەم دەهێنن کە بەکاری دەهێنن وەک پۆشەرێک بۆ جەستەیان کە یارمەتی مانەوەی گەرمی جەستەیان دەدات و دژ بە ئاو دەبێت**

**٢) چینێکی ئەستووری چەوری : ئەم چینە کەمترین پلەی گەرمی لەدەست دەدات بەتایبەت لەکاتی مەلەکردن لەناو ئاوی سەهۆڵاوی و سارد دا**

**٣)سیفەتی ئاڵوگۆڕی گەرمی : پەنگوینەکان لەو بەشەی جەستەیان کە خوێنی گەرمی تێدایە دەڕوات بۆ ئەو شوێنەی جەستەیان کە خوێنەکە تێیدا سارد بووەتەوە بەمەش هاوسەنگی ڕادەگرێت ، بەتایبەت ئەم پرۆسەیەیان پێویست دەبێت بۆ پێ و دەستەکانیان**

**٤)خۆ گونجاندن : (کۆبونەوەی تاکەکان هەموو پێکەوە و لە نزیک یەک تاکو بە گەرمی بمێننەوە و گەرمی هاوبەشی پێ بکەن) (دەست و پەلیان بە جەستەیان دەنوسێنن تا بەگەرمی بمێننەوە)**

**٥) ڕەنگی پەڕی ڕەشی تۆخ لەسەر پشتیان یارمەتیدەرە بۆ هەڵمژینی تیشکی خۆر و مانەوە بە گەرمی لە ڕۆژدا)**

**٦) پاراستنی هێلکە : ئەو هێلکانەی دەیکەن بە گەرمی دەیهێڵنەوە و ڕێگری لێدەکەن لە بەستن بە گەرمکردنەوەی لەڕێگای جەستەیان**



## پرسیار : چۆن گڕکانەکان دەتەقنەوە ؟

**گڕکانەکان بە تێپەڕبوون بە زنجیرەیەکی سەرنجڕاکێشەوە دەتەقنەوە بەم شێوەیە :**

**دروستبوونی ماگما: لە قوڵایی ژێر توێکڵی زەویدا، لە ناو پۆششی زەویدا، گەرمییەکی زۆر بەردەکان دەتوێنێتەوە بۆ مادەیەکی تواوە کە پێی دەوترێت (ماگما). ئەمەش بەهۆی بەرزی پلەی گەرمی و پەستانەوە ڕوودەدات، یان کاتێک پلێتەکانی زەوی دەچنە بەناو یەکدا**

**دەرکەوتنی ماگما: ماگما چڕیەکەی کەمترە لەچاو بەردەکانی دەوروبەریدا ، بۆیە دێتە سەرەوە لەڕێگەی درزەکانی ناو توێکڵی زەویەوە ، لە خەزێنەی ماگما کۆدەبێتەوە ، کە دەکرێت چەند کیلۆمەترێک لە ژێر زەویدا بگرێتەوە**

**دروستبوونی پەستان : بە تێپەڕبوونی کات ، گازەکان لەناو ماگمادا دەتوێنەوە (لەوانەش هەڵمی ئاو و دوانەئۆکسیدی کاربۆن و سەڵفەر دای ئۆکسایدی) بەمەش دەست دەکەن بە فراوانبوون هەتاکو دەگەنە ڕووی زەوی کە تێیدا پەستان نزمە ، بەمەش پەستانێکی بەرز دروست دەبێت لە خەزێنەی ماگما**

**تەقینەوە : کاتێک پەستانەکە زۆر گەورە دەبێت، ماگماکە بە زۆر لە ڕێگەی دەرچەیەک یان درزێکەوە دەچێتە دەرەوە و لە ئەنجامدا تەقینەوەیەک دروست دەبێت. ئەمەش دەتوانێت مادەی جیاواز لەخۆبگرێت:**

- **لەوانەش بۆنمونە (لاڤا) دەڕژێت، ئەگەر ماگماکە کەمتر خۆی گرتبێت**
- **هەروەها هەوری خۆڵەمێشی لە دەرئەنجامی تەقینەوەکە دروست دەبێت ، ئەگەر هاتوو ماگماکە زیاتر خۆی گرتبێت و گازی لەناو خۆیدا گرتبێتەوە**
- **پایرۆکلاستیک : کە دەرپەڕینی خێرای گازی گەرم و خۆڵەمێش و بەردن.**

**دوای تەقینەوەیەک، گڕکانەکە دەتوانێت چاڵی نوێ دروست بکات وەکو چاڵی لاڤا یان کالدێرا (چاڵە گەورەکان کە بەهۆی داڕمانی گڕکانەکەوە دروست دەبن).**

**چاڵی لاڤا**



**گڕکانێکی هەڵچوو**



**پایرۆکلاستیک**



**پرسیار : ئایا هەسارەکان چۆن دروست دەبن ؟**

**هەسارەکان لە ڕێگەی پڕۆسەیەک دروست دەبن کە پێی دەوترێت (accretion) ، لەو پڕۆسەیەدا تۆز و گاز دەوری ئەستێرەیەکی گەنج دەدەن و بەهۆی هێزی کێشکردنەکەیەوە یەکدەگرن ، بەم شێوەیە :**

**١) شیبوونەوەی نیبۆلایی : ئەستێرەیەک دروست دەبێت لە ئەنجامی کۆمەڵە گاز و تۆزێک ، پاشان ئەو بەشەی دەمێنێتەوە بە دەوری ئەستێرەکە ئەڵقەیەک دروست دەکات**

**٢)کۆبونەوەی تۆزەکان : تۆزە وردەکان یەکدەگرن و پارچەی گەورەتر دروست دەکەن هەتاکو دەگاتە شێوەی هەسارەیەک بە دەوری ئەستێرەکەدا**

**٣) هێزی کێشکردن دەستی بەسەردا دەگرێت و بەمەش هەسارەکە تەنی زیاتر لەخۆی کۆدەکاتەوە هەتاکو گەورەتر دەبێت**

## پرسیار : بۆچی پێویستمان بە خەوتنە ؟

**خەوتن ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە پاراستنی تەندروستی ، بەم شێوەیە :**

**١) خەوتن یارمەتی مێشک دەدات کە زانیاریەکان هەڵبگرێت ، لەکاتی خەوتندا مێشک ڕێکخستنەوە بۆ یادەوەری دەکات ، توانای فێربوون زیاد دەکات**

**٢)لەکاتی خەوتندا ، لەش دەست دەکات بە تیمارکردن و چاککردنەوەی خانەکان ، بونیاندنانی ماسولکە ، بەهێزکردنی سیستەمی بەرگری لەش ، دەردانی هۆرمۆنەکانی گەشەکردن کە یارمەتی چاکبوونەوە دەدەن**

**٣)خەو یارمەتی گۆڕینی وزە دەدات بەوەی وزەیەکی کەمتر پێویست دەبێت بۆ بەکارهێنان و بەمەش لەش ئارام و ئاسودە بێت و پشوو دەدات**

**٤)خەوتن یارمەتی جێگیرکردن و هاوسەنگی لە مامەڵە و ڕەفتار و دەربڕینی هەستەکان دەدات**

**٥)مێشک لەڕێگای سیستەمی (glymphatic) پرۆتینە خراپەکان لەکاتی خەودا لە مێشک لادەبات و مێشک خاوێن دەکاتەوە ، چونکە ئەو پرۆتینانە پەیوەستن بە نەخۆشی زوهایمەرەوە**



**پرسیار : ئایا ئاژەڵەکان چۆن پەیوەندی دەکەن بەیەکترەوە ؟**

**ئاژەڵەکان لەگەڵ یەکتر پەیوەندی دەکەن بەڵام جۆری پەیوەندیەکەیان دەگۆڕێت بەپێی گۆڕانی جۆری ئاژەڵەکە و ژینگەکە ، بەم شێوەیە :**

**١)دەنگدارەکان : باڵندە و گورگ و دۆلفینەکان دەنگ بەکاردەهێنن بۆ ناردنی ئاماژەی هەبوونی مەترسی ، یاخود بانگکردنی هاوژینەکانیان ، یاخود هێشتنەوەی پەیوەندی نێوانیان**



٢) زمانی جەستە : سەگەکان کلکیان دەجوڵێنن بۆ نیشاندانی هەستەکانیان ، هەشت پێ (ئەختەبوت) ڕەنگیان دەگۆڕن بۆ دەربڕینی دۆخ و حاڵیان ، هەنگەکان سەما ئەنجام دەدەن بۆ دیاریکردنی ئاڕاستەی خۆراک کە سەماکە ناسراوە بە (waggle dances)



٣)دەردراوی کیمیایی (فیرۆمۆن) : مێرولەکان لە شوێنپێیاندا دەردراوی کیمیایی دەڕژێنن بۆ ڕێنوێنیکردنی مێرووولەکانی تر ، هەندێک شیردەریش دەردراوی کیمیایی دەڕژێن بۆ ئامادەیی زاوزێ



**٤)كارۆموگناتیسی و لەرین : فیلەکان لەرینەوەی سیزمیکی دەگوازنەوە بۆ دەورووبەر تاکو پەیوەندی دوورە مەودا دروست بکەن ، هەروەها مسییەکان لە ڕێگەی شەپۆلی کارەباییەوە پەیوەندی لەگەڵ یەکتر دروست دەکەن کە لەڕێگەی ئەو شەپۆلەوە دەتوانن بە ماسیەکانی بەرامبەریان بڵێن کە چ ڕەگەزێکن ، قەبارەیان چەندە ، تەمەنیان چەندە ، چەندێک دوور یاخود نزیکن**



**٥)بەرکەوتــن و پەیوەنــدی فیزیــایی : بۆنمــونە مەیمــونی شــامپانزای کە لە ڕێــگەی بەرکەوتنەوە پەیوەندی کۆمەڵایەتی دروست دەکەن و متمانە بەیەکتر دەکەن**





## پرسیار : ئایا کات دەتوانێت بوەستێت ؟

کات هەرگیز ناوەستێت ، بەڵام لە هەندێ دۆخی تایبەتدا هێواش دەبێتەوە ، بەپێی تیۆری "ڕێژەیی" ئەنشتاین ، بەپێی ئەو تیۆریە کات جێگیر نییە ، دەگۆڕێت بەپێی خێرایی و هێزی کێشکردن ، هەتاکو تەنەکە خێراتر بڕوات ئەوا کات کەمتر دەخایەنێت و کات بەسەریدا هێواشتر تێپەڕ دەبێت ، بە تیۆری زانایان وای بۆ دەچن کە ئەگەر تەنێک بتوانێت بەخێرایی ڕووناکی بڕوات ئەوا تێپەڕبوونی کات بەسەریدا دەوەستێت ، بەڵام لە واقیعدا هیچ شتێکی بارستەدار ناتوانێت خێراییەکەی بگاتە خێرایی ڕووناکی ، تەنها بە تیۆری ماوەتەوە ، هەندێک لە فیزیازانەکان وای دادەنێن کات تەنها خەمڵاندنی مرۆڤە بۆ گۆڕانکاری ، لە پراکتیکیدا ، ڕاوەستانی کات واتا ڕاوەستانی هەموو تەنەکان لە جوڵە و ڕاگرتنی هەموو چالاکیە ناوەکیەکانی ئەتۆم و گەردیلەکان ، ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت ئەوە دەبێت هەموو تەنێک ڕابوەستێت لە جوڵە ، کە ئەمەش زۆر ئەستەمە



## پرسیار : بۆچی ڕووناکی زۆر خێرایە ؟

**بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش ڕووناکی خێراییە کە خێراییەکەی دەگاتە نزیکەی (٣٠٠) هەزار کیلۆمەتر بۆ هەر چرکەیەک ، ئەمەش واتا ئەگەر من لەسەرچاوەیەکی ڕووناکیەوە بە دووری ٣٠٠ هەزار کیلۆمەتر دوور بم ئەوا پێویستم بە تەنها یەک چرکەیە بۆ ئەوەی ڕووناکیەکە لە سەرچاوەکە بگات بە چاوم و بیبینم ، ئەم خێرایی ڕووناکیە جێگیرە لە سروشتدا ، ناگۆڕێت بە گۆڕانی شوێن و چۆنیەتی جولان ، بەڵام پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە بۆچی ئەمەندە خێرایە ؟**

- **بارستەی نییە : ڕووناکی پێکهاتووە لە فۆتۆنەکان کە بارستەیان نییە ، بەمەش بە خێراترین توانای خۆیان بە گەردووندا تێدەپەڕن**
- **شەپۆلی کارۆموگناتیسی : ڕوناکیەکان شەپۆلی کارۆمۆگناتیسین بەمەش پێویستیان بە ناوەندێکی وەک هەوا و ئاو نییە تاکو بەناویدا تێپەڕێت ، بەناو بۆشاییدا بە ئاسانی تێپەڕدەبێت**
- **بەپێی تیۆری ڕێژەیی ئەنشتاین ، هیچ شتێکی بارستەدار ناتوانێت بگاتە خێرایی ڕووناکی**

**هەتا ئێستا هیچ تەن و ئاماژەیەک نەدۆزراوەتەوە کە لە ڕووناکی خێراتر بێت**

## پرسیار : بۆچی ماسییەکان لەناو ئاودا دەژین ؟

**ماسیەکان دەتوانن بژین لەناو ئاودا چونکە جەستەیان گونجاوە بۆ ناو ئاو ، جیاوازتر لە ئاژەڵەکانی سەر وشکانی ، ماسیەکان بەشێک لە جەستەیان هەیە پێی دەوترێت (Gills) کە لەجیاتی سییەکان کاردەکات ، یارمەتیان دەدات کە ڕاستەوخۆ ئۆکسجین لە ئاوەوە وەربگرن ، بە پێچەوانەی مرۆڤەکان کە ئۆکسجین لە هەواوە وەردەگرن ، هەروەها ماسییەکان ئاو یارمەتی جوڵەی جەستەیان دەدات بەمەش پێویستیان بە ئێسکێکی پتەو نییە تاکو بەکاری بهێنن بۆ جوڵەکردن ، کلک و باڵەکانیان یارمەتیدەرن بۆ ئەوەی بەئاسانی مەلە بکەن ، ئاو یارمەتیدەرێکی چاکە بۆ هاوسەنگ هێشتنەوەی پلەی گەرمی لەشیان ، ئەگەر ماسیەک بهێنینە دەرەوەی ئاوەکان ئەوا ناتوانێت بژی چونکە (Gills) ناتوانێت ڕاستەوخۆ ئۆکسجین لە هەواوە وەربگرێت ، هەربۆیە تەواوی ژیانی ماسیەکان لەژێر ئاودا دەبێت**



## پرسیار : بۆچی زەریاکان سوێرن ؟

**زەریاکان سوێرن بەهۆی باران و ڕووبارەکانەوە کە بەهێواشی بەردە خوێیەکان دەتوێننەوە و دەیانهێننە ناو زەریاکان ، ئەم بەردە خوێیانە بۆنمونە (بەردە خوێیەکانی سۆدیۆم کلۆراید) دەبنە هۆی ئەوەی زەریاکان سوێر بن ، بەڵام بۆچی زەریاکان سوێرێتی خۆیان لەدەست نادەن ؟ لەبەر ئەم هۆکارانە :**

- **بەهەڵمبوون تەنها ئاوەکان لادەبات و خوێکە لە جێگەی خۆی دەمێنێتەوە**
- **ڕووبارەکان خوێی زیاتر و زیاتر دەهێننە ناو زەریاکانەوە**
- **چالاکیە گڕکانیەکانی ژێر ئاوەکان دەبنە هۆی ئەوەی خوێی زیاتر دەهێننە ناو زەریاکانەوە**

**هەندێ شوێنی زەریاکان سوێرترە لەچاو شوێنی تری هەمان زەریا ، بەپێی باران و پلەی گەرمی سوێرێتیەکەیان دەگۆڕێت ، دەریای مردوو یەکێکە لەو دەریایانەی بەرزترین ڕێژەی خوێی تێدایە چونکە کاتێک ئاوەکە لەدەست دەدات هیچ سەرچاوەیەکی ئاوی نییە دووبارە ئەم سوێرێتیە کەم بکاتەوە و ڕوونی بکاتەوە ، بۆیە بەپێی کات هەتا دێت دەریای مردوو سوێرتر و سوێرتر دەبێتەوە ، بەشێوەیەک سوێرە کە تەنها چەند زیندەوەرێکی بچووک دەتوانن تێیدا بمێننەوە و بژین و لەناو نەچن**

## پرسیار : بۆچی شتەکان دەسوتێن ؟

سوتان و گڕگرتن ئەوکاتە ڕوودەدەن کە مادەیەک کارلێک دەکات لە ئۆکسجین و گەرمی یاخود ڕووناکی بەرهەم دەهێنێت ، بۆ دروستبوونی سوتان سێ شتی سەرەکی پێویستن (سوتەمەنی ، ئۆکسجین ، گەرمی) ، بە یەکگرتنی ئەم سێ شتە کارلێکی کیمایی ڕوودەدات ، کە لە بەرهەمی کارلێکەکەدا کاربۆن دایۆکساید $CO_2$ و هەڵمی ئاو و گەرمی دروست دەبێت ، ئەم گەرمییە بەردەوام دەبێت هەتاکو هەموو سوتەمەنیەکە دەسوتێت ، هەریەکێک لە مادەکان لە پلەیەکی گەرمی جیاوازدا دەسوتێت ، هەندێک بەهیچ شێوەیەک ناسوتێن ، بۆنمونە :

- تەختە : بە هێواشی دەسوتێت ، دوکەڵ دروست دەکات چونکە سیلیلۆزی تێدایە ، کە تێکدەشکێت لەکاتی سوتاندن
- کاغەز : گڕ دەگرێت بەخێرایی چونکە تەنکە و چڕیەکەی کەمترە لە تەختە
- گازۆلین : زۆر خێرا گڕدەگرێت لە پلەی گەرمی بەرزدا چونکە سوتەمەنیەکی شلە
- کحول : دەسوتێت بە دروستکردنی گڕێک کە بەباشی بەدی ناکرێت گڕەکە ، چونکە تەنۆلکەی کاربۆنی قورسی تێدا هەیە
- کانزاکان (بۆنمونە مەگنیسیۆم) : زۆر بە گەرمی و بە گەشی دەسوتێن ، هەندێکجار لە یاریە ئاگرینەکان بەکاردێن

- ئـاو و خـۆڵ : گـڕ نـاگرن چـونکه بەشێوەیەک کارلێـک نـاکەن لەگەڵ ئۆکسـجین که ئاگر بەرهەم بهێنن



**پرسیار : چۆن جوڵەی مانگ کاریگەری لەسەر ئاستی ڕووی دەریا و زەریاکانی سەر زەوی دروست دەکات ؟**

**مانگ بەهۆی هێزی کێشکردنەوە دەتوانێت کاریگەری لەسەر ئاستی ڕووبار و دەریا و زەریاکانی سەر زەوی دروست بکات ، هێزی کێشکردنی مانگ ئاوەکانی سەر ڕووی زەوی ڕادەکێشێت بەرەو ڕووی خۆی ، بەمەش ئەو بەشەی ڕووی لە مانگە ئاستی ئاو تێیدا بەرز دەبێتەوە (هەڵکشان) ، لەهەمان کاتدا ئەو بەشەی زەوی کە دوورە لە مانگ ئاستی ئاو تێیدا دادەبەزێت بەهۆی کاریگەری لاوازی هێزی کێشکردنی مانگ لەسەری (داکشان) ، سوڕانەوەی زەوی ڕۆڵێکی کاریگەری هەیە لە بەردەوام گۆڕینی ئەم ئاستی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەیەی دەریا و زەریاکان ، کاتێک مانگ و خۆر لەگەڵ زەویدا دەکەونە سەر یەک هێڵی ڕاست بە ڕیزبەندی (خۆر پاشان مانگ پاشان زەوی) ئەوا کاریگەریەکی زۆر لەسەر ئاستی دەریا و زەریاکان دروست دەکەن و پێی دەوترێت** (spring tides) **، بەڵام کاتێک ڕیزبەندیەکە بەم شێوەیەی لێدێت (خۆر ، زەوی ، مانگ) ئەوا کاریگەریەکە لاوازترە و پێی دەوترێت** (neap tides)

**پرسیار : ئایا باڵندەکان چۆن دەزانن کە پێویستە بەرەو کوێ کۆچ بکەن ؟**

**باڵندەکان بە پشت بەستن بە کۆمەڵە شتێک ئاڕاستەی کۆچکردنیان دیاری دەکەن ، لەوانەش :**

- **بواری موگناتیسی زەوی : زۆرێک لە باڵندەکان (بۆنمونە کۆتر) لەناو چاویاندا جۆرە پرۆتینێک هەیە کە یارمەتیان دەدات هەست بە بواری موگناتیسی زەوی بکەن و وەک قیبلەنمایەک بەکاری بهێنن**
- **خۆر و ئەستێرەکان : هەندێک لە باڵندەکان (بۆنمونە باڵندەی** indigo bunting**) لە ڕۆژدا شوێنی خۆر و لە شەودا شوێنی ئەستێرەکان بەکاردەهێنن بۆ ڕێنماییکردنیان لە کۆچ و گەشتەکانیان**
- **هێما و یادەوەری : ئەو باڵندەیانەی کە بۆ ماوەیەکی دوور کۆچ دەکەن زۆرجار دیمەن و کەنارئاوەکان و شەکانیان لەبیرە بۆ ئەوەی لەسەر ڕێڕەوی خۆیان بمێننەوە (بۆنمونە هەردوو باڵندەی** Canada goose **و** sandhill crane**)**
- **گۆڕانکاری وەرزی : گۆڕانی تیشکی ڕۆژ و پلەی گەرمی یارمەتیان دەدات کە بزانن پێویستە کەی دەست بکەن بە گەشت و کۆچەکەیان**
- **فێربوون : هەندێک لە باڵندەکان لە باڵندە بەتەمەنەکانەوە فێر دەبن**

**پرسیار : ئایا هەنگ چۆن دەتوانێت هەنگوین دروست بکات ؟**

**هەنگەکان هەنگوین دروست دەکەن بە چەند قۆناغێک بەم شێوەیە :**

- هەنگەکان هەڵدەستن بە نیشتنەوە لەسەر گوڵەکان و مژینی (نێکتار nectar)ی ڕووەکەکان ، ئەو بەشەی ڕایدەکێشن لەناو گەدەیان هەڵی دەگرن
- هەنگەکان لەناو گەدەیان ئەو نێکتارە ورد دەکەن و بەو ئەنزیمەی تێیایدایە دەیگۆڕن بۆ جۆرێکی ئاڵۆز لە شەکر
- هەنگەکان ئەو هەنگویەی هەڵیانگرتووە دەیبەن و لە شانەی هەنگوینەکان دایدەنێن
- بە یارمەتی باڵەکانیان ئەو بڕی ئاوەی لەناو هەنگوینەکەیان هەیە لای دەبەن و بەمەش هەنگوینەکە خەستتر و ئەستوورتر دەکەن
- کە هەنگوینەکە ئامادەبوو ، هەنگەکان بە جۆرە مادەیەکی مۆمی دایدەپۆشن و دەیپارێزن
- هەنگەکان ئەم کار و پڕۆسەیە دەکەن چونکە هەنگوین خۆراکی سەرەکی ئەوانە ، لە وەرزە ساردەکاندا کە گوڵەکان نامێنن ، هەنگوینەکان وەک سەرچاوەیەکی خۆراک دەمێننەوە بۆ هەنگەکان

## پرسیار : بۆچی گەدەی مرۆڤ زۆر ترشە ؟ چی دەبوو ئەگەر زۆر تفت بوایە ؟

گەدەی مرۆڤ ترشێتیەکەی زۆر بەرزە کە لەنێوان (١.٥ بۆ ٣.٥) دایە ، ئەم ترشێتیە لە ترشی هایدرۆکلۆریکەوە دێت کە خانەکانی دیواری ناوپۆشی گەدە دەریدەدەن بەم شێوەیە :

- خانەکانی دیواری گەدە : هەڵدەستن بە دەردانی ترشی هایدرۆکلۆریک
- گواستنەوەی ئایۆن : خانەکان لەڕێگەی ($H^+/K^+$ ATPase) هەڵدەستن بە جوڵاندنی ئایۆنەکانی هایدرۆجین بۆ ناو گەدە
- ئایۆنەکانی کلۆر : دەردەدرێن و یەکدەگرن لەگەڵ ئاینۆنەکانی هایدرۆجین بۆ بەرهەمهێنانی ترشی هایدرۆکلۆرید
- ئەم ترشێتیەی گەدە یارمەتیدەرە بۆ تێکشکاندنی خواردن و کوشتن بەکتریا زیانبەخشەکان

کەواتە چی دەبوو ئەگەر زۆر تفت بوایە ؟

- گەدە ئەوکاتەی ترشە دەبێتە هۆی چالاککردنی ئەنزیمی (پیپسین) کە یارمەتیدەرە بۆ تێکشکاندنی پرۆتینەکان ، بەبێ ترشێتی گەدە ، ئەم پیپسینە ناتوانێت چالاک ببێت و بەمەش هەرسکردنی پرۆتین زۆر لاواز و هێواش دەبێتەوە

- گەر گەدە تفت بێت بەکتریایەکی زۆری تێدا کۆدەبێتەوە کە دەتوانن تێیدا بمێننەوە و گەشە بکەن ، لەبەرامبەردا لە گەدەی ترش دەبێتە هۆی کوشتن و لەناوبردنی ئەو جۆرە بەکتریایانە
- ترشێتی پێویستە بۆ هەڵمژینی کانزاکانی وەک ئاسن و کالسیۆم و مەگنیسیۆم لە جەستەدا



**پرسیار : چۆن پلەی گەرمی خۆر دەپێورێت ؟**

**زانایـان بە چەنـد ڕێگەیەک دەتـوانن پـلەی گەرمـی خـۆر دیـاری بـکەن کە ئەویـش ڕێگـا ناڕاستەوخۆکانە ، لەوانەش :**

- **شیکاری ڕوونـاکی** (Spectroscopy) **: خـۆر ڕووناکیەکـانی بە درێـژە شەپۆلی جیاواز ڕەوانەی زەوی دەکـات ، زانایـان دەتـوانن ئەم ڕووناکیـانە بگـۆڕن بـۆ داتـای ژمـارەیی ، ڕەنـگ و تینـی ڕووناکیەکە یارمەتیـدەر دەبێت بـۆ زانینـی پـلەی گەرمی بەشە جیاوازەکانی چینەکانی خۆر**
- **تیشکدانی تەنی ڕەش : خۆر هەنـدێکجار وەک تەنێکـی ڕەش ڕەفتـار دەکـات ، واتـا پـلەی گەرمـیەکەی دەتوانرێـت بـدۆزرێتەوە بە پشـت بەسـتن بە ئامـاژەی درێـژە شـەپۆلییەکانی کە لە ڕوونـاکیەکەوە دەردەچێـت ، بە بەکارهێنـانی یاسـای ویـن** (Wien’s Law) **زانایان دەتوانن پلەی گەرمی ڕووی خۆر بپێون**

**یاسای وین :**

$$\lambda_{max} = \frac{0.0029\,Km}{T}$$

$$\lambda_{max} = wavelength\ of\ maximum\ emission\ in\ meters$$
$$T = temperature\ of\ object\ in\ Kelvin$$

**ئەو گرافەی بە یاسای وین دەست دەکەوێت :**




- ڕوانگەکردنی بەرگەهەوای خۆر : بەرگی دەرەوەی خۆر کە پێی دەوترێت (کۆرۆنا) زۆر گەرمترە لە بەشی ناوەوە ، زانایان دەتوانن بە تلیسکۆبەکانی تیشکی ئێکس و سەروو وەنەوشەیی پلە گەرمیە زۆر بەرزەکان بپێون کە دەگاتە ملیۆنان پلەی سەدی بەرگی دەرەوەی خۆر (کۆرۆنا) :



## تلیسکۆبی تیشکی ئێکس :



## تلیسکۆبی تیشکی سەروو وەنەوشەیی :



- **هیلیۆسـیزمۆلۆجی** (Helioseismology) : **خـۆر هاوشـێوەی زەوی بـومەلەرزە لەسەر ڕووی ڕوودەدات ، ئەم جوڵە خۆرییـانە یارمەتیـدەرن بـۆ ئەوەی زانایـان لە پلەی گەرمی خۆر تێبگەن**



- **کەشتیە ئاسمانیەکان** : **سەتەلایتەکانی** (**سۆهۆ** SOHO) **و** (**پـارکەر** Parker Solar Probe) **تیشـکدانی سـەر ڕووی خـۆر و پـلەی گەرمیەکەی دەپێـون ، چاودێری گۆڕانکاری لە پلەی گەرمی و چالاکیەکان سەر ڕووی خۆر دەکەن**

**سۆهۆ :**



**پرسیار : ئایا خۆر لەچی پێکهاتووە ؟**

**خۆر ئەستێرەیەکە کە پێکهاتووە لە هایدرۆجین بە بڕی (٧٤ ٪) و هیلیۆم بە بڕی (٢٤ ٪) ، هەروەها هەندێک لە توخمە قورسەکانی وەک ئۆکسجین و کاربۆن و نیۆن و ئاسن کە ئەم توخمە قورسانە (٢٪)ی بارستایی گشتی خۆر پێکدەهێنن ، ئەم توخمانەش هەریەکەیان گرنگی خۆی هەیە بەم شێوەیە :**

- **هایدرۆجین : توخمی هەرە سەرەکی ناو خۆرە ، سوتەمەنیە بۆ گڕگرتن لەسەر خۆردا ، دەگۆڕێت بۆ هیلیۆم و وزەیەکی زۆر دەردەپەڕێنێت**
- **هیلیۆم : دووهەم توخمە لەسەر خۆر ، هەتا زیاتر خۆر بمێنێتەوە زیاتر هیلیۆم لە ناوکەکەی کۆدەبێتەوە**
- **ئۆکسجین (O) : بەشدارە لە کارلێکە گەردیلەییەکان لە بەرگەهەوای خۆردا**
- **کاربۆن (C) : بەشدارە لە کارلێکەکانی یەکگرتن، بەتایبەتی لە ئەستێرە گەورەترەکاندا.**
- **نیۆن (Ne) : ڕۆڵی هەیە لە هاوسەنگی ڕاگرتنی تیشکدان لەلایەن خۆرەوە**
- **ئاسن (Fe) : بە بڕێکی کەم دەدۆزرێتەوە، یارمەتی دارِشتنی چالاکیی موگناتیسی خۆر دەدات.**

- **سیلیکۆن (Si)، مەگنیسیۆم (Mg)، گۆگرد (S)، نایترۆجین (N) و ئەوانی تر : بە ڕێژەیەکی کەم بەردەستن ، بەشدارن لە داینامیکی ئاڵۆزی خۆر.**

**لەگەڵ بەردەوامبوونی خۆر هایدرۆجین بە شێوەیەکی بەردەوام دەگۆڕێت بۆ هیلیۆم. لە ملیارەها ساڵدا کاتێک هایدرۆجین کەم دەبێتەوە، یەکگرتنی هیلیۆم دەست پێدەکات و توخمە قورسەکانیش بەرهەم دەهێنێت.**



# پێڕست

